

حوكمی سوكایەتی كردن و تانەدان لە

حوكمی سوكایەتی كردن و تانەدان لـە

# ئیسلام و قورئان و پێغەمبەر

صلى الله عليه وسلم


نووسەر

همام سعید


ئامادەكردن

كۆمەڵی

ڕزگاربوو

# پوختەیەك لەحوكم و سزای تانەدان و سوكایەتی بەئیسلام و پیرۆزییەكانی
# (زاتی الله ، قورئانی پیرۆز، ئاینی ئیسلام ، پێغەمبەر ﷺ)

نوسینی : مامۆستا هومام سەعید

ئامادەكردنی : كۆمەڵی ڕزگاربوو

## بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على محمد وعلى آله وصحبه ومن ولاه ... وبعد:
لە سەردەمی غوربەت¬و نامۆی ئەهلی دیندا، سەردەمی تفی شەمەکانی دەیجوری جاهیلی بەڕوی پرشنگی ڕوناکی هیدایەتی خواییدا، سەردەمی هێرشی هەمەلایەنەی فیتنەو بێباوەڕی بەڕوی پیرۆزییەکانی دینی هەق¬و پەیامی یەکتاپەرستیدا ... پێویستە تاکی موسوڵمان پشکۆی ئارامی لەچنگ بگرێت¬و هەردەم چاوو دڵی بەنوری وەحی ئیلاهی ڕوناکبێت هەتا لەفیتنەی هەڵخلیسکان¬و لاڕێبون لەدینەکەی پارێزاوبێت بەویستی خوا .
یەکێك لەو فیتنە زیندووانەی ئەمڕۆ ڕوی لەموسوڵمانان کردووە تانەدان¬و سوکایەتکردن¬و بێڕێزییە بە پیرۆزییەکانی دینەکەیان لە ( زاتی الله تعالى¬و پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه و سلم¬و ئایەتەکانی قورئان¬و دروشمەکانی ئیسلام ... ) بۆیە بە پێویستمان زانی بۆ بەرچاو ڕونی هەموان بەڕوناکی وەحی خوایی لەڕوی حوکمی شەرع¬و سزاو شوێنەوارە خراپە کانی ئەو دیاردە نامۆیە لێرەدا¬و بەکورتی ئاماژە بەو بابەتە بکەین¬و لوێچێك لەدەریای باس¬و خواسی پڕبایەخی ئەو بابەتە بخەینە پێش چاوی هەموو ئەوانەی دەیانەوێت لەڕوانگەی نیگای ئاسمانییەوە لەراستیەکان بگەن¬و لەسەرسنورەکانی راوەستن. بۆیە پشت بەخوا دەڵێین:

## حوکمی سوکایەتی کردن:

ئەوەی لەدینی ئیسلامدا زانینی بەزەرورتێکی دینی دانراوەو تاکی موسوڵمان بەهیچ شێوەیەك ناتوانێت لەبارەیەوە بەهانە بەنەزانین بێنێتەوە ئەوەیە کە : تانەدان¬و سوکایەتی¬و جنێودان¬و بێڕێزینواندن بەهەر جۆر¬و شێوازێك لەشێوازەکانی بێت بەرامبەر زاتی الله تعالى¬و پێغەمبەرەکەی¬و قورئان¬و پیرۆزیەکانی دین کوفر¬و لەدین دەرچونە¬و سزاکەشی بریتییە لە کوشتن . ئەوەش بە بەڵگەکانی قورئان¬و سوننەت¬و ئیجماعی زانایانی ئیسلام .
وەهەروەها بەکۆدەنگی زانایان هیچ جاوازییەك نییە لەنێوان تانەدان¬و سوکایەتکردن بەخوا یان پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه و سلم یان دین یان ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز یان حوکمەکانی لەڕوی

شوێنەوار¬و حوکمەکانیانەوە ...

**بەڵگەکان :**

١- خوای پەروەردگار دەفەرمێ: ﴿ وإِنْ نَكَثُوا أَيْمَانَهُمْ مِنْ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا فِي دِينِكُمْ فَقَاتِلُوا أَئِمَّةَ الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لا أَيْمَانَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنْتَهُون ﴾ التوبە:١٢.

واتە: گەر پەیمانەکانیان شکاندوو توانج¬و تەشەریان لەدینەکەتاندا دەسا ئێوەش بجەنگن لەگەڵ پێشەوایانی کوفردا چونکە ئەوانە هیچ پەیمانێك نافامن هەتا کۆڵدەدەن¬و واز لەو کوفرەکەیان دێنن . .

لێرەدا خوای گەورە تانەدەری لەدین ناو بردووە بەئیمام لەکوفردا، ئەمەش زیادەیە لەسەر حوکمی بەتەنها کوفر.

**پێشەوا ئیبن تەیمییە رەحمەتی خوای لێبێ دەفەرموێ:** (بەهۆی تانەدانیان لەدین ناوی بردوون بەپێشەوایانی کوفر، ئیدی سابت بووە کە هەموو تانە دەرێك لەدین ئیمامە لەکوفردا ). الصارم المسلول:١٧ و ٥١٢ و٥٤٦.

**ئیبن کەسیر رەحمەتی خوای لێبێ دەفەرموێ:** (لەم ئایەتەدا ئەو حوکمە وەردەگیرێت کە ئەوەی جنێو بە پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم دە دات وە یان تانە لەدینی ئیسلام دەدات، وە یان بە توانجەوە ناوی دەبات دەکوژرێت).

**ئیمام قورتوبی رەحەتی خوای لێبێ دەڵێت:** (ئەوەی پەیمان شکێنی بکات¬و تانە لەدین بدات دەبێتە ئەسڵ¬و سەر لەکوفردا ، وە ئەو کەسە لەپێشەوایانی کوفرە ).

٢-وە خوای گەورە دەفەرمێ: ﴿ وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ * لا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ...﴾ التوبە:٦٥-٦٦.

ئەم ئایەتە سەبارەت بەکەسانێك هاتە خوارەوە کە لەگەڵ پێغەمبەر¬ صلى الله عليه و سلم¬و یارانیدا لەرێگەی جیهاد بوون بەڵام بەگەمەو لاقرتی تانەو تەشەریان لەقورئان خوێنەکان دەدا ، دەبینین خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێ: گەر لە بارەی ئەوەی کە ووتویانە پرسیاریان لێبکەیت ، دەڵێن : ئێمە مەبەستمان لەو کارەمان سوعبەت¬و گەمەو گاڵتە بووە، تۆش پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بەخواو ئایەتەکانی خوا¬و پێغەمبەرەکەی گەمە¬و لاقرتیتان دەکردا!؟ بەهانە مەهێننەوە بەدڵنیای ئێوە لەپاش ئەوەی

ئیمانتان هێنا کافربوون.

**پێشەوا ئیبن تەیمییە لەتەفسیری ئەم ئایەتە دەفەرموێ:** (ئەمە دەقێکی رونە کەگاڵتەجارِی بەخواو ئایەتەکانی¬و پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه و سلم کوفرە، ئیدی جنێودان¬و سوکایەتیکردن گەر بەنیازەوەبێت لەپێشترە بەوحوکمە . وە دیسان ئەم ئایەتە بەڵگەیەکی روونە کەسوکایەتی¬و لاقرتیکردن بەراِستی¬و جددی بێت یان بۆ گەمەو سوعبەت بێت یەکسانە، چونکە دەبینین خوای گەورە نافەرمێ درۆتان کرد بەگەمەتان نەبوو، بەڵکە دەفەرموێ : نابێتە بەهانە بۆتان وە ئێوە بەو کارەتان لەپاش ئیمان کافر بوون ... ).

**وە دیسانەوە دەفەرموێ:** (بێ گومان ئەوانە هەواڵیان لەبارەوە دراوە کە لەپاش ئیمانیان کافربون ، هەرچەند دەڵێن ئەوکارەمان بێ مەبەست بوەو لە باوەرِنەمانەوە نەبووە بەڵکو تەنها (نخوض ونلعب) گەمە و گاڵتەوگەپمان کردووە.

**٣- ئیمام ئەبوداودوو نەسائی بەسەنەدێکی سەحیح لەئیبن عەبباسەوە گێراِویانەتەوە** کەپیاوێکی نابینا خێزانێکی هەبوو جنێوو تانەی لەپێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم دەدا ئەو پیاوەش شەوێك خێزانەکەی خۆی بەوهۆیەوە دەکوژێت . کەهەواڵکە دەگاتە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم خەڵك کۆدەکاتەوە و دەڵێت: بۆ خوا پێتان دەڵێم ئەوەی ئەوکارەی کردووە مافی منی لەسەرە باهەستێت. بۆیە پیاوەکە هەستاو هاتەلای پێغەمبەری خوا¬و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم ئەو ژنە خێزانی من بوو وە دوو منداڵی مرواری ئاسام لێی هەیە چەندین جار سوکایەتی بەتۆ دەکرد هەرچەندە دەمترسان بەڵام سودی نەبوو هەتا دوێنێ شەو قسەی پێوتی منیش شمشێرێکم کرد بەسکیاو کوشتم .ئەو کات پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم فەرموی: ( ئەوا من ئێوە دەکەمە شاهید کەخوێنی ئەو ئافرەتە بەزایەچووە).

**پێشەوا ئیبن تەیمییە دەفەرموێ:** ( ئەم فەرمودەیە بەڵگەیەکی رِون¬و ئاشکرایە لەسەر جائیزی کوشتنی ئەو ئافرەتە بە هۆی جنێودانی بەپێغەمبەری خواوە صلى الله عليه و سلم ، وە بەڵگەیە لەسەر کوشتنی (ئەهلی زیممە). وە دیسان بەڵگەیە لەسەر کوشتنی موسوڵمان (پیاو بێت یان ئافرەت) گەر جنێوبدات ).

## ٤- وتەی زانایان لەو بارەوە:

**پێشەوا ئیبن تەیمییە دەفەرموێ:** (بەئیجماعی زانایان گەر موسوڵمانبوو واجبە بکوژرێت چونکە بەوە کافرو مورتەددە، وە خراپترە لەکافری ئەسڵی کەخوا بەگەورە دەگرێت¬و باوەرِی وایە ئەو دینەی

لەسەریەتی گاڵتەجاری نییە بەخوا ) . الصارم المسلول.

**وە دەفەرموێ :** ( بێ گومان جنێودان بەخوا یان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم کافربونە o لەرِواڵەت¬و ناوەرۆکدا (ظاهراً وباطناً )، ئیدی جنێودەر باوەرِی وابێت ئەو کارەی حەرامە یان بەحەڵاڵی بزانێت، یان بێئاگابێت ، ئەمە مەزهەبی زانایان¬و سەرجەم ئەهلی سوننەیە ئەوانەی دەڵێن ئیمان وتە¬و کردارە (القول والعمل). ئەگەر ئەوکەسە موسوڵمانبوو بەکۆدەنگی سەرجەمی زانایان (الاجماع) کوشتنی واجب دەبێت) الصارم المسلول.

**وە دەفەرموێ :** (بێگومان وتەی زانایان لەهەموو مەزهەبەکان یەکە کە ئەوکەسەی سوکایەتی دەکات o کافرەو خوێنی حەڵالةَ). الصارم المسلول

**وە ئیمام احمد دەفەرموێ:** (ئەوە پاشگەزبووە لەئیسلام و لەگەردنی دەدرێت.)o

**وە شێخ مولا علی قاری دەڵێت:** (ئەوەی وەسفی خوابکات بەشتێکی نەشیاو بەخوا کافر دەبێت).o

**ئیمام خەتتابی دەڵێت:** (نەمان بیستووە کەموسوڵمانان ناکۆك¬و جیاوازبن لەحوکمی واجبی کوشتنی o جنێودەر بەخوا یابەدین ).

**وە زانای ناودار فەخری رِازی دەڵێت :** (گاڵتەجارِی بەدین بەهەر شێوەیەك بێت کافر بوونە بەخوا ) وە o

## بەهەمان شێوە ئیمام (ئیسحاق بن راهویە و قاضی عیاض و مرداوی و آلوسی...) ئیجماعی زانایانیان لەم بارەوە گێرِاوەتەوە.

**وە لە بارەی قورئانی پیرۆزەوە پێشەوا قازی عیاز دەفەرموێ :** بزانە ئەوەی سوکایەتی بەقورئان بکات ،یان بە جوزئێکی، یان تانە یان جنێوی پێبدات ، یان نکوڵی لێبکات¬و رەددی بکاتەوە ، یان ئینکاری لەئایەتێکی بکات یان پیتێکی، یان باوەرِی پێی نەبێت یان بەبەشێکی، یان برِوای بەحوکمێکی صەریحی یان هەواڵێکی نەبێت ، یان برِوای بەپێچەوانەی ئەو هەبێت، ئەوە کافرە بە کۆدەنگی (ئیجماع) زانایان ). الشیفا¬و.
ئیمانداری بەرێز ئەمە حوکمی دینی خوایە لەمەرِ کەسێیك کە نکوڵی لەئایەتێك یان پیتێکی ئەم قورئانە بکات _گەر کار بەبەشەکانی تریشی بکات _ ئیدی دەبێت حاڵ¬و حوکمی ئەوانە چۆن¬و چی بێت کە سوکایەتی پێدەکەن¬و پارە پارەی دەکەن¬و فرِێیدەدەنە ناو پیسایییەوە، یا حوکم¬و یاساکانی وەلا دەنێن¬و برِیارەکانی رەد دەکەنەوە ، یان نایکەنە حوکمرِانی نێوانیان¬و داوەری پێناکەن¬و، بۆ چارەسەری کێشەکانیان دەگەرِێنەوە بۆ یاسا دانراوەکان¬و دەستوە شیرکییە بەشەریەکان وە برِیارەکانی پێش حوکم¬و برِیارەکانی قورئان دەخەن .. !!؟؟ .
پاش ئەوەی بەبەڵگەی قورئان¬و فەرموودە¬و ووتەی زانایان بۆمان رِونبووەوە کەجنێو¬و سوکایەتی یان

تانەدان لەپێغەمبەر صلى الله عليه و سلم¬و ئاین¬و قورئانی پیرۆز کوفرە¬و خاوەنەکەی بەکافر-و پاشگەزبوو(مورتەد) دادەنرێت ، وە بەپێی وتەی زانایان کوشتنی لەسەر موسوڵمانان واجب دەبێ، پێویستە لێرەدا بەکورتی ئاماژەش بەهەندێ لەوحوکم¬و شوێنەوارە ترسناکانەبکەین کە لەدەرەنجامی پاشگەزبونەوە لەدین (ریددە) پێویست دەبێت هەتا زیاتر هەست بەگەورەی¬و سەختی ئەو تاوانە بکەین.

## شوێنەوارەکانی پاشگەزبونەوە لەدین بەهۆی بێڕێزی¬و سوکایەتیکردنەوە :

١. کەسی پاشکەزبوو لەئیسلام (مورتەد) حوکمی کوشتنە واتە خوێنی حەڵاڵ دەبێت ، ئیدی یەکسانە پیاوبێت یان ژن ، وەك ئیمام بوخاری لەئیبن عەبباسەوە گێڕاویەتییەوە کەپێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم فەرمویەتی : "مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ" . واتە: ئەوەی دینەکەی گۆڕی بیکوژن ..

٢. دروست نییە بکرێتە وەلی¬و سەرپەریشتیار بەسەر کاروباری موسوڵمانانەوە_ سەرپەرشتیاری گشتی یان تایبەت_، وەك حوکومڕانی¬و دادوەری¬و ماڵپارێزی¬و سەرپەرشتیاری منداڵی موسوڵمان، وەلی بەشودانی کچی یان ژنهێنانی کوڕی چونکە خوای گەورە دەفەرموێ : (وَلَنْ يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً) النساء:١٤١.

٣. ئافرەتی موسوڵمانی لێمارە (نیکاح) ناکرێت ،وە گەر خێزانی بوو عەقدی نێوانیان هەڵدەوەشێتەوە چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: (لا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ) الممتحنه:١٠.

٤. میرات لەکەسی موسوڵمانی ناگرێت وە میراتی لێناگیرێت ،وەك پێشەوامان صلى الله عليه و سلم دەفەرمێ: "لا يرث المسلم الكافر، ولا يرث الكافر المسلم" رواه مسلم.

٥. سەربڕاوی حەرام دەبێت ، چونکە موسوڵمانبونی سەربڕ مەرجی حەڵاڵی سەربڕاوە.

٦. ئەگەر مرد ناشۆرێت ، وە کفن ناکرێت¬و نوێژی لەسەر ناکرێت، وە دوعای بەزەی¬و لێخۆشبونی بۆ ناکرێت ، وە لەگۆڕستانی موسوڵماناندا نانێژرێت بەڵکە وەك کەلاکێك دەشاردرێتەوە .

٧. پاشان لەدوارۆژدا ئاگری سەختی جەهەنەمی هەمیشەی چارەنوسیەتی کەبەئەبەدی تێیدا دەمێنێتەوە،

وەك زاتی پەروەردگار دەفەرمێ: (وَمَنْ يَرْتَدِدْ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ) البقرە:٢١٧.

واتە: وەئەوەی لەئێوە لەپاش موسوڵمانبونی لەدینەکەی پاشگەزبێتەوە وەلەسەر ئەو پاشگەزبونەوەی بمرێت ئەوانە لەدونیاو دوارِۆژدا کردەوەکانیان بەتاڵدەبێتەوە، وە ئەوانە هاوەڵی ئاگرن¬و بەهەمیشەی تێیدا دەمێننەوە.

وەچەندین شوێنەواری خراپی دیکە کەزانایان لەئەحکامی مورتەددا باسیان لێوەکردووە .

## چەند نمونەیەك لەسوکایەتی و تانەدان لەدین :

دەبینین ئەمرِۆ لەنێو خەڵکیدا چەندین نمونەی سوکایەتی¬و تانەدان هەیە کەپێویستە ئێمەی ئیماندار ئاگاداری بین¬و خۆمانی لێبپارێزین¬و ، پاشانیش بەئەرکی سەرشانمان هەستین لەهۆشیارکردنەوەی خەڵکی لێیان لەوانە:

١. فرِێدانی ئەو کتێب¬و نوسراوانەی ئایەت¬و ناوی خوایان تێدایە بۆ ناوزبڵدان یان ژێر پێخستنیان ، وە یان بەکارهێنانیان بۆ پاککردنەوە ، یان هەر شێوەیەکی تری بێرِێزی نواندن وەك ئەمرِۆ بەچاوی خۆمان دەیبینین پەنا بەخوا.

٢. بە گۆرانی کردنی ئایەتەکانی قورئان یان ناوەکانی خوا، یان هاوتاکردنی بەمۆسیقا لەو جێیانەی کە خراپەکاری تێدا دەکرێت، یان لەمەسرەح و سینەمادا بەشێوەی گاڵتەجارِی. یان بەنوکتەکردنیان بۆ پێکەنین¬و مەجلیس خۆشکردن..!! یان کەسێك بیستنی گۆرانی¬و مۆسیقای بەلاوە خۆشتر یان پەسەندتر بێت لەبیستنی قورئان.

٣. وەهەروەها سوکایەتی بەبانگ¬و سیواك¬و رِیش¬و حیجاب¬و پۆشاکی ئیسلامی پیاوان¬و ئافرەتان . یان پێی وابێت باڵا پۆشی ئافرەتان دواکەوتوییەو نەشیاوە بۆ ئەم سەردەمە. یان پێیوابێت ئافرەت لەئیسلامدا مافی نەدراوە¬و لەسایەی ئیسلامدا چەوسێنراوەتەوە.....هتد

٤. یان کەسێ بڵێ: فڵان کەس خواش چاری ناکات ، یان فڵان کەس دەسەڵات یان موڵکی خوای هەیە ، یان بڵێ: خوا بێتەخوار یان داواملێبکات _یان هەروتەیەك لەم بابەتانە _ ئەوکارە ناکەم !!.

٥. یان بە شێوەی گلەی بڵێ: فڵان حەرامە بمرێ، یان زوڵمە لەو تەمەنەدا بمرێت..!!.یان بۆ فڵان شت حەرامە ؟ یان بۆ واجب کراوە.. ؟!!.

٦. سەیرکردنی ئەو دراماو حەلقانە یان گوێبیستی ئەو گۆرانیانەی کەتێیاندا سوکایەتی بەدین-و پیرۆزییەکانی ئیسلام دەکرێت بەخۆشحاڵی¬و رازی بونەوە یان بۆ گاڵتە¬و کات بەسەربردن .
ئەمانە¬و چەندین شێوەی دیکە لەسوکایەتی وگاڵتەجارِی بەدین¬و پیرۆزییەکان کەلەلایەن خاوەنەکانیانەوە گوێیان پێنادرێت. وەك ئیمامی ئیبن¬وماجە بەسەنەدێکی سەحیح لەئەبوهورەیرەوە دەگێرێتەوە کەپێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم فەرمویەتی: "إِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سُخْطِ اللَّهِ لاَ يَرَى بِهَا بَأْسًا فَيَهْوِي بِهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ سَبْعِينَ خَرِيفًا" واتە: بێگومان کەسی واهەیە وتەیەك دەڵێت¬و هیچ بایەخی پێنادات بەڵام دەبێتە مایەی تورِەی¬و رەنجاندنی خوا¬و بەهۆیەوە بەناخی جەهەنەمدا دوورتر لەنێوانی رۆژهەڵات¬و رۆژ ئاوا دەیباتەخوارێ. والله المستعان
لەکۆتایدا ئەوەی ماوە بیڵێم کە بەهێزترین بەڵگە¬و دیارترین نیشانە لەراستی خۆشەویستیمان بۆ خواو پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه و سلم¬و قورئان¬و ئاینەکەمان لەپابەندی زیاترمان بەمەنهەجی وەحی خوای¬و هەوڵ¬و تێکۆشانمان بەئامانجی سەرخستن¬و پاراستی پیرۆزییەکانی دین دەردەکەوێت ، وە پێویستە ئەوەشمان لەیادبێت کەبەرگری لەموقەدەسات¬و پیرۆزییەکانی دینەکەمان لوتکەی بڵندی خواپەرستی¬و شوناسی ئیمانداریمانە ...

فالدين رأس المال فاستمسك به * فضياعه من أعظم الخسران

وصلى الله على نبينا محمد و على آله و صحبه أجمعين.